حکومە[illegible] - عێراق
وەزار[illegible]
بەڕێو[illegible]م و چاپەمەنییەکان
Kurdistan Regional Government
Ministry of Education
G.P. of Curriculum & Printings



# پەروەردەی ئیسلامی

## بۆ پۆلی شەشەمی بنەڕەتی

حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پەروەردەی ئیسلامی

## پۆلی شەشەمی بنەڕەتی

ئامادەکردنی

عبـدالله عبـدالرحمن بابان — فاروق محمد علی عباس

ئازاد عمـر سـيد أحـمد — صـادق عثمان عـارف

پێداچوونەوەی زانستی

د. بەشیر خەلیل تۆفیق — ئەبو بەکر عەلی کاروانی

وەرگێڕانی

عبـدالله عبـدالرحمن بابان

پێداچوونەوەی زمانەوانی

سادق ئەحمەد عوسمان روستایی

چاپی دووەم

١٤٣٧کۆچی - ٢٠١٦زایینی - ٢٧١٦کوردی

# پێشەکی

پەروەردە کارانی بەڕێز، ئەم پەرتوکە بۆ پۆلی شەشەمی بنەڕەتییە، هەر وەکو لە قۆناغەکانی پێشوودا ڕەچاوتان کرد، شێوازی خستنەڕووی بابەتەکانمان گۆڕیوە، هەروەها جۆرەکانیشیان، بەڕێزتان تێبینی ئەوەش دەکەن کە چیرۆکی ئامانجدار لە وانەکانی ئەم پەرتوکەدا هەن، مەبەستیش لەم چیرۆکانە ئاسانکارییە بۆ تێگەیشتنی بابەتەکان لە لایەن قوتابییانو خوێندکارانەوە.

وەك باسیشمان کرد، بە هۆی گۆڕینی ئەم پرۆگرامە داوا کارین لە پەروەردە کاران شێوازی شیکردنەوەو خستنەڕووی بابەتەکان بۆ قوتابییان بگۆڕن، بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە ئامانجە پەروەردەییەکانی ئەم پەرتوکەی بۆ دانراوە.

جەخت لەوە دەکەینەوە کە دابەشکردنی ئەم پەرتوکە بە مەبەستی ڕێکخستنی بۆ دوو وەرزە، مامۆستاش بۆی هەیە پابەندی ئەم وانانە نەبێت، بابەتەکان دابەشی سەر وانەکان بکات، بە مەبەستی سوود گەیاندن بە قوتابییان، بە هۆی سوود وەرگرتن لە چالاکییەکانو ڕاهێنانەکانی کە پاشکۆی بابەتەکانی پرۆگرامەکەن.

چاوەڕوانیین پەروەردەکارانی بەڕێزیش هەر تێبینییەکی بنیات نەریان هەبوو بەشداری لە دەوڵەمەندکردنی پرۆگرامەکە بکات بۆمانی بەرز بکەنەوە.

داواکارین لە یەزدان سەرکەوتوومان بکات لەوەی سودی هەیە بۆ کاروانی پەروەردەو فێرکردن لە کوردستان.

لیژنەی ئامادەکرن

## لە ناوە پیرۆزەکانی خودا

(المصور):

ئەوەی وێنەو شێوازێکی تایبەتی بە هەموو دروستکراوەکانی خۆی بەخشیوە.

(الغفار):

ئەوەی کاری خراپ لە دونیادا دادەپۆشێتو لە دوا رۆژدا لێی دەبورێت.

(القهار):

ئەوەی بەسەر ستەمکاران سەردەکەوێت بە مردنو سەرشۆڕکردنیان، بەر بەستیش لە پێش فەرمانیدا نییە.

(الباسط):

چاکەی خۆی بە ئەوانە دەبەخشێت کە شایستەن.

(القابض):

چاکەی خۆی لەوانە وەردەگرێتەوە کە شایەنی نین.



## سورەتی (الضحى)

بسم الله الرحمن الرحيم

(( وَالضُّحَى ① وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى② مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى③ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَى④ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى⑤ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى⑥ وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى⑦ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى⑧ فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ⑨ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ⑩ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ⑪ ))

**صدق الله العظيم**

**راڤه** :

(والضُحى)سوێند دەخۆم بە چێشتەنگاو.(والليل اذا سجى)سوێند بە شەو کاتێك بە تاریکیەکەی زەوی دادەپۆشێت.(ما ودّعك ربُّك وما قَلى) پەروەردگارت نە وازی لە تۆ هێناوە، نە لێت قەڵسە*.(وللآخرة خيرٌ لك من الاولى) دیارە دوارۆژ بۆ تۆ لە دنیا چاکترە.( وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى) لە ئایندەدا پەروەردگارت چاکەی وەهات لەگەڵ دەکات رازی دەبی.( أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى) ئایا بێ باوك نەبووی ئەو پەنای پێدای؟ (وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى) بینی گومڕای و رێی نیشان دای؟ (وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى) دی هەژاری و لە ئاتاجی رزگاری کردی؟ (فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ) سا تۆش هەتیو مەڕەنجێنە. ( وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ) دەرۆزەکەر(سواڵکەر) مەتۆرێنە.( وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ) تۆ هەر باسی بەخششەکانی پەروەردگارت بکە.

**گفتوگۆ** :

١ – مانای ئەم ئایەتە پیرۆزانە بنووسە:

ئ – (وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ).

ب – (وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ).

٢ – خودای گەورە لە سورەتی (الضحى) بە چی سوێندی خواردوە؟

٣ – خودای گەورە لە ئایەتەکانی (٣و٤و٥و٦و٧و٨) وتارەکەی ئاراستەی کێ کردووە؟

٤ – لە رۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزە ((فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ)).

باسی پاداشتی چاکە لە گەل هەتیودا بکە.

---

* قەڵسە: بەخەشم و تورەیە

# خێری چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا



دەگێڕنەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەر (د خ) گەنجێك هەبوو، زۆر خوداپەرست بوو نوێژو ڕۆژو چاکەی زۆری دەکرد، ئەم پیاوە نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی زۆر گران بوو، هاوسەرەکەی چووە خزمەت پێغەمبەر (دخ) پێی ڕاگەیاند:(مێردم زۆر نەخۆشە بۆیە ویستم حاڵیت پێ ڕابگەیێنم).

پێغەمبەر (دخ) عەمارو سوهەیب و بیلالی ناردن بۆ لای ، وپێیانی گوت شایەتمانی پێ بێنن، ئەوانیش چوون بۆ لای گەنجەکە بینیان کە لە دوا هەناسە دایە بۆیە شایەتمانیان تەلقین کرد، بەلاّم زوبانی بە شایەتمان نەدەگەڕا، ئەوانیش هەواڵەکەیان بە پێغەمبەر(دخ) ڕاگەیاند.

پێغەمبەر (دخ) فەرمووی: کەس لە دایبابی زیندووە؟

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا دایکێکی پیری هەیە، پێغەمبەر (دخ) بە دوایا نارد

به قاسیدەکەی گوت: ئەگەر دەتوانیٚ بڕوات با بێتە لای پێغەمبەری خودا.

قاسیدەکە چوو بۆ لای قسەی پێغەمبەری خودای پیٚ ڕاگەیاند.

ئەویش گوتی: گیانم بە قوربانی بێت لە سەر منە بچمە خزمەتیو دەستی دایە داریٚکو چووە خزمەت پێغەمبەر(دخ) وسەلامی لیٚکردو ئەویش وەلآمی سەلامەکەی دایەوەو پێی گوت: دایە ڕاستیم پیٚ بڵیٚ چونکە ئەگەر ڕاستی نەڵێی ئەوا سروشم لە خوداوە بۆ دێت: کورەکەت لەگەڵ تۆدا چۆن بوو؟

دایکی کورەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا نوێژو ڕۆژو چاکەی زۆری دەکرد.

پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: ئەی تۆ؟

دایکی کورەکە گوتی: من لێی تووڕەم. ئەو زۆر چاودێری منی نەدەکرد وسەرپێچی فەرمانی دەکردم.

پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: تووڕەبوونی دایکی وای کردووە کورەکەی زوبانی لاڵ بێت لە گوتنی شایتمان.

ئەوجا فەرمانی بە بیلال دا: بڕۆ دارێکی زۆر کۆبکەوە.

دایکی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا چ دەکەی؟ ئەویش فەرمووی: لە پێش تۆ بە ئاگر دەیسوتێنم.

دایکی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا دڵم بەرگەی ئەوە ناگرێت کوڕەکەم لە پێش چاوم بە ئاگر بسوتێنیت.

پێغەمبەر(دخ) فەرموی: سزای خودا توندترو بەردەوامترە، گەر دەتەویٚ خودا لێی خۆشبێت ئەوا لێی ڕازی بە، سوێند بە وەی نەفسی منی بە دەستە نە نوێژ نە ڕۆژو و نە چاکە بە کەڵکی کورەکەت نایەت گەر تۆ لێی تووڕە بیت.

دایکی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من خودا و هەموو فریشتەکانیو ئەو موسڵمانانەی لێرە ئامادەن دەکەمە گەواهیدەر کە لە کورم ڕازی بووم.

پێغەمبەر(دخ) فەرموی: بیلال بڕۆ بزانە دەتوانێت بڵێت (لا اله الا الله) یان نا؟ نە وەك دایکی لە شەرمی من ئەو قسەیەی کردبێت.

کاتێك بیلال چووە ژوورەوە گوێی لیٚ بوو کورەکە دەڵێت: (لا اله الا الله).

بیلال چووە ژوورەوەو گوتی: خەڵکینە تووڕەبوونی دایکی وایکردبوو

زوبانی لاڵ بێت لە گوتنی شایەتمان، ڕەزامەندی ئەو زوبانی کردەوە.

لە هەمان ڕۆژدا کورەکەی گیانی لە دەست دا، پێغەمبەر (دخ) فەرمانی دا بیشۆن‌و کفنی بکەن‌و نوێژی لە سەر کردو ئامادەی بە خاکسپاردنی بوو.



## راهێنان

(١)

مامۆستا بە گوێرەی ئاستەکانیان داوا لە قوتابییەکان دەکات ئەو ئایەتانەی سورەتی (ئیسرا) بخوێننەوە کە باس لە چاکە لە گەڵ دایباب دەکەن.

(٢)

مامۆستا داوا لە هەندێك لە قوتابییان بکات چیرۆکێك یان بە سەر هاتێك ئامادە بکەن کە باس لە رێزگرتنی دایباب دەکەن بۆ وانەی داهاتوو بە هاوکاری خێزانەکانیان.

(٣)

وشە لە گەڵ یەك گونجاوەکانی هەردوو ستوون بە یەك بگەێنە.

| | |
|---|---|
| رێزگرتنی دایباب | (بابە) بانگ دەکەین |
| واخفض لهما | کاتی دواکەوتن لە چوونەوە بۆ ماڵ |
| دەبێت داوای لێبوردن بکەین | (دایە) بانگ دەکەین |
| باوك بە | جناح الذُّل |
| دایك بە | ئەرکی سەر شانی منداڵانە |

## چالاکی :

١ – ئەم دوو ئایەتە لە سورەتی ئیسرا راڤە بکە: ((وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴿٢٣﴾ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴿٢٤﴾)) (الاسراء ٢٣-٢٤)

وانەی چوارەم

## لە نەریتەکانی سەردان

# روخسەت وەرگرتن‌و پیێ حەسیان*



سەردان یەکێکە لە ئاکارەکانی موسڵمانان، بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی هاوسۆزی لە نێو کۆمەڵگەدا؛ بەڵام سەردان نەریتی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێت مەردوم پێوەیان پابەند بێت، لە بەر چەند هۆیەك، لەوانەش: هەر ماڵێك‌و دانیشتوانەکەی ڕێزی خۆیان هەیە، ماف خۆشیانە ئامادە بن بۆ بەخێرهێنانی ئەو کەسەی سەردانیان دەکات.

هەر ماڵێك ماف گشتی خۆی هەیەو بە پێی ئەو مافەش کەس بۆی نییە بچێتە ناوی‌و ببینێت چی تێدایە، بە بێ ڕەزامەندی، سنووری ڕەزامەندی وەرگرتنیش سێ جارە، گەر خاوەن ماڵیش ڕێگەی نەدا، یان لە ماڵەوە نەبوو، ئەوا دەبێت ئەو کەسە بگەڕێتەوە.

بەڵام ئەگەر خاوەن ماڵەکە لەوێ بوو، ئەوەی سەردانی دەکات پێ حەسیا بۆی هەیە بچێتە ژوورەوە. بۆیە سەردان دوو مەرجی هەیە: (مۆڵەت وەرگرتن‌و پێ حەسیان).

مرۆڤ ماف چوونە ناو ئەو ماڵانەی نییە، کە کەسانێك تێدا دەژین بە بێ (مۆڵەت وەرگرتن) بۆیە گەر کەسمان لەو ماڵە نەبینی لە پاش سێ جار داوا کردنی چوونە ژورەوە، ئەوا دەبێت بگەڕێینەوە.

تەنها لە هەندێك حاڵەتی تایبەتیدا، دەشێت بچینە هەر ماڵێك بە بێ مۆڵەت وەرگرتن، وەکو: ئاگر کەوتنەوەیەکی لە ناکاو، یان کاتێك دزێك بچێتە سەر ئەو ماڵە.

**گفتوگۆ :**

١ – له گەڵ هاوپۆلەکانت و به یارمەتی مامۆستا جیاوازی نێوان (مۆڵەت وەرگرتن و پیٚ حەسیان) شیبکەنەوە، به هۆی دیمەنێکی نواندن.

٢ – ئەم ئایەتە قورئانییە شی بکەوە:(( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)) (النور٢٧).

٣ – به هاوکاری مامۆستا ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(دخ) شیبکەوە:

((اذا استأذنَ أحدُكمْ ثلاثاً، فلمْ يؤذن لهُ فليرجِع)) (بوخاریو موسلیمو ئەبو داوود ریوایەتیان کردووە).

٤ – ئایا بۆمان هەیە بچینە ناو ماڵێك کە شتومەکی خۆمانی تێدا بێت؟ وەڵامەکەت به دەقێکی قورئان بسەلمێنە.

**چالاکی :**

ئەم ئایەتە پیرۆزانە راڤەبکەن:

(( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ )) (النور٢٧ – ٢٨).

---

* پیٚ حەسیان: استئناس

# دورکەوتنەوە لە فیز لێدان (لەخۆبایی بوون)



دوورکەوتنەوە لە لەخۆباییبوون یەکێکە لە ئاکارەکانی موسوڵمان چونکە (بە خۆ نازین‌و خۆ بە زلزانین بە سەر خەڵکانی دیکەوەو بە لاف رۆیشتن بەسەریان لە ئاکاری موسڵمان نییە.

خەڵکی هەموویان یەکسانن‌و هەمووومان لە باوە ئادەمین‌و ئادەمیش لە خۆڵ دروستکراوە، بۆیە نابێت مرۆڤ بە فیز بێت لە گەڵ خەڵکیدا، رووی خۆی لە خەڵك وەرگێڕێت،و بە جۆرێك رێ بکات کەیف بە خۆ هاتنی تێدابێت، نکوڵی لە بەخششەکانی خودای تێدا بێت، چونکە خودای گەورە ئەو کەسەی خۆشناوێت کە لە خۆی بایی بێت‌و لاف بە سەر خەڵکی لێبدات‌و خۆ لەوان بە گەورەتر بزانێت.

نابێت ژیانی دونیا پەلکێشی لە خۆباییبوونمان بکات، وەك رووەکێك کە خاوەنەکەی کاتێك باران دەبارێت‌و سەوز دەبێت پەسەندی دەکات، دواتر زەرد دەبێت‌و وشك دەبێت‌و هەڵدەوەرێت‌و لە ناو دەچێت.

بۆیە مرۆڤ دەبێت سود لەم بەڵگەو ئامۆژگاری‌و بەسەر هاتانە وەربگرێت.

لە خۆباییبوون وا لە مرۆڤ دەکات روو لە ژیانی ئەم دونیایە بکات‌و لە بەر رابواردنی ئەم دونیایە رۆژی دوایی لە بیر بکات، بۆیە نابێت رێ بە شەیتان بدەین لێکمان بکات‌و هیوای لێخۆشبوونمان لای خودا بۆ نەهێڵێتەوە لە خراپەکاریش بەردەوام بین.

**گفتوگۆ** :

١ – بۆچی دەبێت مرۆڤ خۆی لە لەخۆ باییبوون بپارێزێت؟

٢ – بە یارمەتی مامۆستاکەت ئایەتێك لە قورئان بێنە کە باس لە ژیانی ئەم دونیایە دەکات؟ دواتر گفتوگۆی لە سەر بکەن.

٣ –هۆکارەکانی لەخۆبایی بوون چی یە؟



# یەکسانیو ڕێزگرتن لە مافی خەڵك



مامۆستا: قوتابییە خۆشەویستەکانم ئاینی ئیسلامی پیرۆز ڕێزی داناوە بۆ نەوەکانی ئادەم تا ئەوپەڕی پایەکانی بەڕێزی، سەرەڕای جیاوازی ئاینو نەژادو ڕەنگیان.

خودای میهرەبان دەفەرموێت: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)).(الحجرات١٣).

لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە، جیاوازی لە نێوان نێرو مێو ڕەش پێستو سپی پێستو دەوڵەمەندو هەژاردا نییە.

خۆشەویستانم ئایە ڕەوایە لە نێوان موسوڵمانو نا موسوڵماندا جیاوازی بکەین؟

قوتابییان: نەخێر، نابێت.

مامۆستا: ئیسلام ئازادی بە نا موسوڵمانان داوە پەرستشو بیرو باوەڕی ئاینی خۆیان بە جێ بگەیێنن.

شوان: بەڵێ ڕەشۆ ئێزیدییەو ڕێز لە خۆیی و بیرو باوەڕی دەگرین.

یەشار: لە گەڕەکەکەمان خێزانی مەسیحی نیشتەجێن، خێزانەکانمان هاتوچۆیان دەکەن لە کاتی بۆنەو جەژنەکاندا.

مامۆستا: هەمووتان چاك دەکەن، بەڵکو دەبێت لە هەموو کاتێکدا ڕێزیان لێ بگرین. قورئانی پیرۆز ئەم بەها بالأیانەی بڕیار داوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ((وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً))(الاسراء٧٠).

خۆشەویستانم، کوردستانی خۆشەویستمان لە دێر زەمانەوە ئاینو ئاینزاو بیرو باوەڕی جۆراو جۆری لە خۆ گرتووە، لە هەموو شارو گوندەکانی. ئایە دەزانن ئەم ئاینانە چین ؟

یەشار: مەسیحی.

مامۆستا: ئافەرین.

شیرین: جولەکەو ئێزیدی.

مامۆستا: بەڵێ، هەروەها ئاینزا و ئاینی دیکەش هەن وەك کاکەیی و زەردەشتی.



## راهێنان

١ – ئەم شوێنی پەرستشانە بە ئاینەکانیان بگەێنە:

| | |
|---|---|
| ئیسلام | کنیشتە |
| مەسیحی | مزگەوت |
| جولەکە | لالش |
| ئێزیدی | کڵێسا |

٢ – ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە وشەی گونجاوی نێو کەوانەکان پڕ بکەوە:

(یەکسانی – جیاوازی نە کەین – ڕێزی)

ئ – دەبێت ........ گشت بیرو باوەڕە ئاینییەکان بگرین.

ب – ئیسلام داوای ............ دەکات لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە.

پ – دەبێت .......... لە نێو خەڵکیدا بە هۆی ئاینیان یان ڕەنگیان یان نەژادیان.

**سود:**

ئیسلام ئاینی برایەتی و خۆشەویستی و ئاشتییە.

**چالاکی :**

١ – ئەم ئایەتە پیرۆزە لە بەربکە:

((يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)). (الحجرات١٣).

٢ – ئەم فەرموودە پیرۆزە لە بەربکە:

پێغەمبەر (دخ) فەرمویەتی: ((النَّاسُ سواسيةٌ كأسنانِ المِشطِ)).



# چاکە کردن



ماموٚستای پەروەردەی ئیسلامی داوای لە خوێندکارانی پۆلی شەشەمی بنەڕەتی کرد لە پۆل بێنە دەرەوە، بۆ ئەوەی بە شێوازێکی کرداری فێری کاری چاکەیان بکات کە سودی هەیە بۆ خەڵك، سەرەتا دەستیان کرد بە خاوێنکردنەوەی دەرگاکانی قوتابخانەکەیان‌و دواتر باخچەکەی‌و گۆڕەپانەکەی‌و شۆستەی دەرەوەی قوتابخانەو دەوروبەری و هەروەها هەموو ئەو دارانەیان ئاودا کە لە باخچەی قوتابخانەکەو شۆستەکانی دەرەوەن... هتد.

وەك شانەی هەنگ بە کۆمەڵ (گروپ) کاریان دەکرد، لە پاش تەواو بوونی کارەکەیان، ماموٚستا خوێندکارەکانی لە باخچەی پشتەوەی قوتابخانە کۆکردەوەو لێیانی پرسی: چی فێربووین ؟ چۆن ئەنجاممماندا ؟ کارەکە چەندی خایاند ؟ هەست بە چی دەکەن لە پاش ئەم ماندووبوونە ؟ کێتان فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەرمان بۆ دێنێتەوە لە سەر ئەم کارەی ئەنجاممماندا ؟

ماموٚستا ماوەیەکی پێدان تا بیر بکەنەوە بۆ وەڵامدانەوە، قوتابییانیش بۆ ئەم مەبەستە گروپیان پێك هێنا بوو، وەك پێشتر ماموٚستا فێری کردبوون، پاش ماوەیەکی کورت ژیار چووە پێش وەك نوێنەری گروپەکەی، بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری یەکەم: ئەوەی فێری بووین، ماندوو

بوونه له پێناو خەڵکیو پاراستنی پاكو خاوێنی ژینگەو جوانی سروشت.

روناك دەستی هەڵبڕی له جیاتی گروپەکەی خۆی کە ناوی (تیمی فریاکەوتن)ـە، بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیاری دووەم بداتەوە، گوتی: بە هاوکاریو هاوسۆزی لە نێوانماندا کارەکەمان ئەنجام داو ئەمەش وای کرد ئەرکەکە بە ماوەیەکی کورت ئەنجام بدەین.

قوتابییەکی دیکە گوتی: بە هیچ شێوەیەك هەستمان بە ماندوو بوون نەکرد؛ چونکە وەك شانەیەکی هەنگ کارمان دەکرد، بە شێوازیکی کرداری خۆشو هەستکردن بە دڵخۆشی.




قوتابییان سوپاسی مامۆستایان کردو داوایان لێکرد خۆی ئەو فەرمودەیەیان بۆ بێنێتەوە کە لە گەڵ کارەکەیان دەگونجێت.

مامۆستاش لە دوای ئەوەی سوپاسیکردن بۆ ئارامیو هاوکاریان، گوتی: رۆڵەکانم، ئاینە پیرۆزەکەمان هانمان دەدات کە هاوکار بین بۆ خێرو سوود بەخشین، پێغەمبەرمان(دخ) دەفەرموێت:(( خيرُ النّاسِ انفعهم للنّاسَ )). واتە: باشترین کەس ئەو کەسەیە سودی بۆ خەڵك هەبێت.

هەروەها گوتی: هاوەڵانی پێغەمبەر(دخ) جوانترین نمونەیان لە سەر هاوکاری نواند لە نێو خۆیاندا، بۆ نموونە کاتێك موسوڵمانانی مەککە کۆچیان کرد بۆ مەدینە ، پشتیوانەکان کردنیان بە هاوبەشی خۆیان لە سامانو کێڵگەو زێر، تەنانەت هەندێکیان بە هاوەڵە کۆچکرەکانیان گوت:

گەر رەزامەند بیت یەکێك لە هاوسەرکانمت بۆ تەڵاق دەدەم، بەمەش بوونە سەرکردەو سەرداری جیهان، سەرەڕای هەژاریو نەبوونیان، لە ماوەیەکی کورتدا.

پێغەمبەری خۆشەویستمان (دخ) دەفەرموێت:(( انَكُمْ لَنْ تَسَعُوا النَّاس بأموالِكُمْ، وَلكِنْ سَعُوهُمْ بِـأَخلاقِكُمْ )) واتە: ئێوە هەموو خەڵکی بە پارەو سامان ناگرنە خۆ، بەڵام بە رەوشت بیانگرنە خۆتان.



**گفتوگۆ :**

١ – مامۆستا چی  لە قوتابییەکان داوا کرد ؟

٢ – بۆچی قوتابییان هەستیان بە خۆشی کرد لە ئەنجامدانی کارەکە ؟

٣ – موسوڵمانە کۆچکردووەکانو پشتیوانەکان لە مەدینە چۆن هاوکاری یەکدی بوون ؟

**چالاکی :**

**ئەم فەرمودە پیرۆزە لە بەر بکە:**

**پێغەمبەری خۆشەویستمان (دخ) دەفەرموێت:(( انَكُمْ لَنْ تَسَعُوا النَّاس بِأموالِكُمْ، ، وَلكِنْ سَعُوهُمْ بِأَخلاقِكُمْ )).**



# کشتوکاڵکردن



لە کاتی گەڕانەوەی لە قوتابخانە هەردی باوکی بینی لە باخچەی ماڵەکەیان نەمامەکان ئاو دەدات و گەڵا هەڵوەریوەکان کۆ دەکاتەوە، هەردی لە باوکی پرسی هۆی ئەم بایەخدانەی بە باخچەکە چییە، باوکی وەڵامی دایەوەو گوتی:

کوڕەکەم: پەیوەندی مرۆڤ بە خاکەوە لە دێر زەمانەوە رەگی داکوتاوە، کاتێك مرۆڤ بینی کە سودێکی زۆر لەم خاکە بە دەست دێنێت، ئەمەش هەموو ژیارە کۆنەکان جەختیان لە سەر کردۆتەوە، کاتێك ژیارەکانیان لە نزیك رووبارە گەورەکان بنیات نا، وەك : ژیاری (دۆڵی دوو زێ) لە نێوان رووباری (دیجلەو فورات) لە عیراق و ژیاری (دۆڵی نیل) لە نزیك روباری (نیل) لە میسر.

ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش جەختی لە سەر کاری کشتوکاڵی کردووە، هەروەها پێغەمبەر(دخ)و هاوەڵانی لە دوای خۆی گرنگی زۆریان بە کشتوکاڵ داوە.

پێغەمبەر (دخ) لە گەڵ خەڵکی خەیبەر رێککەوت لە سەر بەشێك لە بەرو بووم.

هەردی گوتی: باوکە دەبێت ئێمە هەمووان کاری کشتوکاڵ بکەین ؟

باوکی وەڵامی دایەوە: کوڕی خۆم، گەر هەندێك خەڵك کاری کشتوکاڵ بکەن ئەوا پێداویستی ئەوانی دیکە دابین دەبێت. چاندنی دارو درەخت لە ناوەوەو دەرەوەی شارەکان سودی هەیە بۆ خۆشکردنی ئاوو هەوا، شاریش هەردەم سەوزی دەنوێنێت، ئەمەش ئەرکی هەمووانە.

**گفتوگۆ :**

١ – بە یارمەتی مامۆستاکەت هەوڵ بدە ناوی هەندێك رووەك بنووسی کە لەقورئاندا ناویان هاتووە و جیاوازی نێوان (چەقاندن) و (چاندن) روون بکەوە.

٢ – بە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (دخ) گرنگی کشتوکاڵ رون بکەوە.

٣ – چۆن پارێزگاری لە داری پارك و باخچەی قوتابخانە دەکەین ؟



## سورەتی ئەلشەرح (الشرح)

بسم اللّه الرحمن الرحيم

((أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَب ﴿٨﴾))

صدق اللّه العظيم

**راڤە:**

(أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ) ئەدی ئێمە سینگی تۆمان فراوان نەکرد؟(وَوَضَعْنَا عَنْكَ وِزْرَكَ) قورساییشمان لە سەر شانەکانت لا نەبرد؟ (الَّذِي أَنْقَضَ ظَهْرَكَ) ئەوەی پشتی چەماندبووی؟ (وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ) ناوبانگیشتمان بەرزکردیەوە. (فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً) لە پاش تەنگانە خۆشی دێت.(إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً) ئاریٚ لە پاش تەنگانە خۆشی هەیە.

(فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ) هەرکە لە کارەکەت تەواو بووی ، راستبەوە بۆ کارێکی دیکە..(وإلى ربك فأرغب) ئەوسا روو لەپەروەردگارت بکە.

**گفتوگۆ :**

١ – مەبەست لە گوتاری خودا لەم ئایەتە کێیە :(( الم نشرح لك صدرك )).

٢ – مەبەست لەم ئایەتە چییە؟ ((ان مع العسر يسرا)).



# چەند وێنەیەك لە خۆنەویستی هاوەڵان (ر.خ)



خۆنەویستی واتای ئەوەیە کە کەسانی دیکە لە خۆت لە پێشتر بزانیت، بۆ بە دەستهێنانی بەرژەوەندییەك یان سودێك یان بەر گرتن لە زەرەرێك، یەکەم نەوە لە موسوڵمانان پێشەنگی چاکبوون بۆمان، لەم رەوشتە چاکە، کە لە لایەن خودای گەورە زۆر رەوشتێکی خۆشویستراوە.هەر وەك رەوشتە چاکەکانی دیکە.

ئا بەم وشانە مامۆستا چووە ناو باسەکەوە، پێش ئەوەی کارەکان بە سەر قوتابییەکاندا دابەش بکات، کە لێی کۆبووبوونەوە، لە دوای ئەوەی لە هەولێرەوە گەیشتنە هاوینە هەواری بێخاڵ، لە گەشتێکی بەهاریدا.

شوان کە یەکێك بوو لە خوێندکارەکان داوای لە مامۆستا کرد چیرۆکیکی جێکەوتیان بۆ بگێڕێتەوە لەم بوارە، چونکە بەرێزی مامۆستای پەروەردەی ئیسلامییەو لە ژیاننامەی پێغەمبەر(دخ)و هاوەڵانی(رخ) شارەزاییەکی باشی هەیە.

مامۆستا سوپاسی کردو گوتی: کاتێك موسوڵمانان لە مەکەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لە دوای خۆیان سامانو کەسو کاریان جێهێشتبوو، پێغەمبەر (د.خ) برایەتی بنیاتنا لە نێوان هەر موسوڵمانێکی کۆچکردووی خەڵکی مەکە -کە ژمارەیان کەم بوو- وموسوڵمانێکی پشتیوانی

خەڵکی مەدینە، هەر موسوڵمانێکی خەڵکی مەدینە ئارەزووی دەکرد بەشی لەم کارە چاکە هەبێت.

سەعدی کوری رەبیعی- پشتیوان- بووە براو پاڵپشتی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کۆچکردوو.

سەعد بە عەبدولڕەحمانی گوت: دوو رەزم هەن، دەمەوێت خۆت سەر پشك بیت و بۆ خۆت هەڵبژێریت کام رەزت دەوێت ، چونکە من لە دەوڵەمەندترین خەڵکی مەدینەم و سامانێکی زۆرم هەیە.

عەبدولڕەحمان زۆر سوپاسی کردو نزای خێری بۆ کردو گوتی: خودا ماڵ و خێزانەکەت بپارێزێت و بەرکەت بخاتە ناویان، تەنها ئەوەم لە تۆ دەوێت رێی بازاڕم نیشان بدەیت؛ چونکە من دەمەوێت لە دەستکەوتی کاری خۆم نان بخۆم، هەروەها بە هێزم و توانای کارم هەیە.

جا عەبدولڕەحمان کاری کردو خوداش دەرگای رۆزی و دەهەندی لێکردەوەو بووە خاوەن سامانێکی باش، بە هۆی پشت بە خۆ بەستن لە پاش پشت بە خودا بەستن.

بەم کارەی سەعد نمونەیەکی بێ وێنەی نواند لە خۆنەویستی، ئەی رۆڵەکانم دەبێت ئێمەش لە نێو خۆماندا ئاوەها بین، خودای گەورەش دەربارەی ئەو هاوەڵانە دەفەرموێت:((ويـؤثرون على انفسهم ولو كان بهم خصاصة)).

دوای ئەوە سارا هەستا چیرۆکێکی خۆنەویستی دەربارەی پێشەوا عەلی کوری ئەبو تالیب (رخ) لە گەڵ خێزانەکەی گێڕایەوە، کە باوکی بۆی گێڕابووە، کە زانایەکی ئاینییە، ئەویش بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەستی پێکرد:((وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۝ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا۝))(الانسان ٨-٩) لە سەر پێشەوا عەلی و خێزانەکەی هاتۆتە خوارەوە، چونکە بۆ ماوەی سێ شەو لە دوای یەك بە برسێتی مانەوە، لە بەر ئەوەی ئێوارەی هەر سێ رۆژەکە (هەژارێك و هەتیوێك و دیلێك)ی برسی دەهاتە بەر دەرگایان، ئەوانیش خۆیان برسی دەکردو نانەکەیان بەوان دەبەخشی لە رێی خودا بۆ ئەوەی تێر بخۆن.

بە مەش هەموو قوتابییان تێگەیشتن کە مرۆڤ دەبێت چۆن رەفتار بکات لەگەڵ مرۆڤی برای، بۆیە هەر یەکێکیان هەستا و دەستیکرد بە ئەنجامدانی کارێك، بۆ ئەوەی هاوڕێیەکەی بحەسێتەوە، بەمەش رۆژی گەشتەکەیان بە خۆشی بردە سەرو بە ئاسوودەیی ئێوارە گەڕانەوە بۆ هەولێر، و توانیشیان لەو کاتەی لەناو پاسەکە بوون ئەو ئایەتە پیرۆزانە لە بەر بکەن بە یارمەتی مامۆستاکەیان، دەیانگوت: سوپاس بۆ خودا بە ساغی و سەلامەتی گەڕاینەوە.

**راهێنان :**

مامۆستا هەڵدەستێت بە دابەشکردنی قوتابییەکان بۆ چەند تیپێك، بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو قوتابییانە بدەن کە لەوان بچووکترن و لە پۆلەکانی یەکەم و دووەمن، لە گۆڕەپانی قوتابخانەو کاتێك لە شەقام دەپەڕنەوە لە پاش کۆتایی هاتنی دەوام. ئەمەش گیانی برایەتی و خۆنەویستی و هاوکاری لە دڵیاندا دەچێنێت.

**گفتوگۆ :**

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١ – قوتابییەکانی پۆلی شەشەم لە گەشتەکەیان بۆ کوێ چوون ؟

٢ – کێ داوای لە مامۆستا کرد چیرۆکێکیان دەربارەی خۆنەویستی بۆ بگێڕێتەوە ؟

٣ – کێ چیرۆکەکەی خۆنەویستی پێشەوا عەلی(ر.خ) گێڕایەوە ؟

٤ – پێشەوا و خێزانەکەی چەند رۆژ بە برسێتی مانەوە ؟ بۆ چی ؟

**چالاکی :**

مامۆستا داوا لە قوتابییان دەکات لەماڵەوە حاڵەتێك یان وێنەیەك لە خۆنەویستی یان هاوکاری، کە گوێ بیستی بووبن یان لەگەڵیدا ژیابن لەگەڵ کەس و کاریان، تا لە وانەی داهاتوو بیگێڕنەوە و یان بیخوێننەوە.

## وانەی یازدەم

### چەند وێنەیەك لە ژیانی شوێنكەوتوان

# زاناو ستەمكار



دەگێڕنەوە كە حەجاجی كوڕی یوسفی سەقەفی كۆشكێكی بۆ خۆی دروستكرد لە شاری واست – ئێستا پێی دەوترێت كوت – كاتێك كۆشكەكەی تەواو كرد، داوای لە خەڵكی كرد بێن بۆ تەماشاكردنو نزای پیت و فەڕی بۆ بكەن.

زانای گەورە حەسەنی بەسری نەیویست هەلی كۆبوونەوەی خەڵك لە دەست بدات، كە لە دیارترین زانایانی ئەو سەردەمە بوو، لە پیاوە دیارەكانو شوینكەوتوانیش بووە، ئەوانەی لە سەردەمی پێغەمبەر (دخ) نەژیاون بەڵام لە گەڵ هەندێك لە هاوەڵانی ژیاون، دژ بە حەجاج دەوەستاو لە نێو خەڵكدا بە ئاشكرا باسی لە كارە خراپەكانی دەكردو وتەی هەقی بە روویدا دەگوت.

حەسەنی بەسری چووە شوێنەكە بۆ ئەوەی گوتارێك بۆ خەڵكەكە بخوێنێتەوەو بە بیریان بهێنێتەوە كە دونیا هیچ نییەو ئەوەی لە لای خودایە ئەو بە نرخترە.

كاتێك گەیشتە شوێنەكەو دیتی كە خەڵكەكە بە سەرسوڕماوی لە ئاست هونەری تەلار سازی كۆشكەكە وەستاون، پێیانی گوت:((كاتێك رامانین لەوەی خراپترین كەس دروستیكردووە، دیتمان كە فیرعەون لەمە مەزنترو بەرزتری دروست كردبوو، دوایی خودا فیرعەونی لە ناو بردو هەموو كۆشكو تەلارەكانی تێكدا، خۆزگە حەجاج دەیزانی كە ئەوانەی لە ئاسمانن رقیان لێیەتیو

ئەوانەی لە سەر زەوین مەرایی بۆ دەکەن)).

یەکێك لە ئامادەبووان ترسا ئازاری بدەن، گوتی:

- لە سەر خۆبە باوکی سەعید ... لە سەر خۆبە.

حەسەنی بەسری فەرموی:

- خودا پەیمانی لە خاوەن زانستەکان وەرگرتووە کە بەرچاوی خەڵك رون بکەنەوەو راستییەکان نەشارنەوە.

لە رۆژی دواییدا حەجاج زۆر تورەبوو، فەرمانی دا حەسەنی بەسری بهێنن بۆ ئەوەی سزای بدات، کاتێك هێنایانو چووە جێی کۆبوونەوەکە، کە حەجاج چاوی پیٚ کەوت پێی گوت: فەرمو باوکی سەعیدو لە سەر جێی خۆی داینیشاند، ئەوانەی لەویٚ ئامادەبوون سەریان سورما.

کاتێك حەسەنی بەسری دانیشت حەجاج چەند پرسیارێکی دەربارەی ئاین لی پرسی، حەسەنی بەسریش زۆر لە سەرەخۆو بە رەوانی و زاناییەوە وەڵامی دەدایەوە.

حەجاج پێی گوت: تۆ گەورەی زانایانی.

کە حەسەنی بەسری هاتە دەرەوە، خەڵکەکە لێیان پرسی نهێنی ئەو هەڵوێستە چیبوو، حەسەن فەرموی: کاتێك چوومە لای گوتم: ئەی بەخشندە پشتو پەنام لە لێقەومان، تورەبوونەکەی سارد بکەوە و سەلامەتم کەی لەدەستی، وەك چۆن ئاگرەکەت بۆ ئیبراهیم سارد کردەوەو کردتە مایەی سەلامەتی.

**دەرئەنجام** :

لەم چیرۆکە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا دەبێت زانایان رۆڵەکانی کۆمەڵگە رێنوێنی بکەن بۆ خێرو چاکسازیو وەستان بە رووی ستەمکاراندا، ونابێت هاوڕییەتیان بکەن لە ستەمو زۆرداریدا.

**پرسیار :**

١ – حەسەنی بەسری ڕێنوێنی خەڵکەکەی بۆ چی کرد ؟

٢ – ئەم زانایە بۆ نەترسا کاتێك چووە لای حەجاج ؟

٣ – ڕۆڵ‌و ئەرکی زانایان لە ژیانی کۆمەڵگەدا چییە ؟

**نزا :**

خودایە تۆرە بوونی ستەمکاران سارد بکەوە وە بیکە سەلامەتی بۆمان، وەك چۆن ئاگرەکەت بۆ ئیبراهیم سارد کردەوەو کردتە مایەی سەلامەتی.

**چالاکی :**

چی دەزانیت دەربارەی ژیاننامەی زانا حەسەنی بەسری لە ڕاپۆرتێکی کورتدا بینووسە.



# کوڕەکەی جێنشین

پێشەوای باوەڕداران (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) پازدە منداڵی هەبوو، سێیان کچ بوون، هەموویان چاکەخوازو لە خودا ترس بوون، بەڵام عەبدولمەلیکی کوڕی -کە ناوەنجیان بوو- لە هەموویان چاکەخوازتر بوو،زۆر لە خودا دەترسا.

کاتێك باوکی بووبە پێشەوای باوەڕداران و پۆستی جێنیشینی وەرگرت، وتارێکی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە، داوای لێکردن لەم کارە بیبەخشن، بەڵام خەڵکەکە سووربوون لە سەر ئەوەی ئەو پۆستە وەربگرێت، بۆیە پێیانی گوت:

- ئەی خەڵکینە ئەوەی گوێڕایەڵی خودا بێت، گوێڕایەڵکردنی دەبێتە ئەرك و ئەوەی لە خوداش یاخی بوو، لە سەر کەس ئەرك نییە گوێڕایەڵی بێت.

ئەی خەڵکینە:

- ئەی خەڵکینە گوێڕایەڵم بن تا ئەو کاتەی گوێڕایەڵی خودا دەبم، ئەگەر بێ فەرمانی خوداشم کرد ئەوا گوێڕایەڵ بوون لە سەر ئێوە نابێت بە ئەرك.

دوای ئەوە لە سەر دوانگە هاتە خوارەوەو بەرەو ماڵەکەی بە ڕێ کەوت، لەوێش چووە ژوورەکەی خۆی، مەبستی بوو دەمێك بحەسێتەوە لە پاش ماندووبوونی.

بەڵام هێشتا سەری نەنابووە سەر جێ، عەبدولمەلیکی کوڕی -کە تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو- هاتوو و پێی گوت:

- دەتەوێت چ بکەی ئەی پێشەوای باوەڕداران ؟!

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گوتی:

- دەمەوێت هەندێك چاوەکانم گەرم بکەم، چونکە وزە لە لەشمدا نەماوە.

عەبدولمەلیکی کوڕی گوتی:

- چاوت گەرم دەکەیت پێش ئەوەی ماڤ خەڵکی بگەڕێنیتەوە، ئەی پێشەوای باوەڕداران؟!

گوتی: کوڕی خۆم دوێنی بە درێژایی شەو نەنووستوم، کاتی نیوەڕۆ لە پاش ئەوەی پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکەم، مافەکان بۆ خاوەنەکانیان دەگێڕمەوە، گەر خودا بیەوێت.

کوڕەکەی گوتی: پێشەوای باوەڕداران کێ دڵنیای کردووی کە تا نیوەڕۆ بژیت؟!

ئەم وتەیە هەستی عومەری بزواندو خەوی لە چاوەکانی تۆراندو هێزو توانای بە جەستە

ماندووەکەی بەخشیو گوتی:

- لێم نزیك بەرەوە کوڕی خۆم، کوڕەکەی لە باوەش گرتو نێو چاوانی ماچ کردو گوتی:

- سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە لە پشتم ئەو کەسەی هێناوەتە دونیا بۆ ئەوەی لە ئاینەکەمدا یارمەتیم بدات.

پاشان هەستاو و فەرمانی دا بانگ رابهێشترێت لە نێو خەڵکیدا:

هەر کەسێك داوایەکی هەیەو ماڤی خوراوە با بەرزی بکاتەوە.



دەرئەنجام:

لەم بەسەر هاتە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە مرۆڤ دەبێت ئامۆژگاری پێشکەش بەو کەسانەش بکات کە لە خۆی گەورەتریش بن چ بە تەمەن بێت یان بە پایە، وەك چۆن عەبدولمەلیکی کوڕی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، لە تەمەنی حەڤدە ساڵی باوکی- کە جێنیشین بوو - ئاگادارکردەوە.

دەبا نمونەی ئەم جۆرە گەنجانە بکەین بە پێشەنگی خۆمانو سوود لە ژیانو تاقیکردنەوەکانیان وەربگرین.

## پرسیار :

١ – جێنیشین عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بۆچی نازناوی جێنیشینی راشیدی پێنجەمی لێنرا ؟

٢ – بۆچی عەبدولمەلیك نەیهێشت باوکی لە یەکەم رۆژی دەست بەکاربوونی بحسێتەوە؟

٣ – ئەرکی منداڵ بەرامبەر بە باوەکەکانیان چییە؟ بە تایبەتی ئەوانەی باوکەکانیان پلەو پایەی و بەرپرسیاریەتی گشتی لە حکومەت وەردەگرن؟

## چالاکی:

پوختەیەك دەربارەی ژیانی جێنیشین عومەر کوڕی عەبدولعەزیز بنووسە، بە تایبەتیش دادپەروەری کە ئەم پیاوە ناوبانگی پێ دەرکردبوو.



## سورەتی ئەلکافرون (الکافرون)

بۆ تێگەیشتن و وەرگرتن

بسم الله الرحمن الرحيم

(( قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ))

صدق الله العظيم

## راقه :

( قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) بێژه ئەی خودانەناسەكان.( لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ) ئەوەی ئێوه دەیپەرستن، نایپەرستم.(وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ) ئەوەی منیش دەیپەرستم ، ئێوه نایپەرستن. (وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ) ئەوەش پەرستوتانە من نایپەرستم. (وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ) ئەوەی دەیپەرستم، ئێوەش نایپەرستن. (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ) ئاینی خۆتان بۆ خۆتانو منیش ئاینی خۆم بۆ خۆمە.

### چیرۆكی هاتنه خوارەوەی ئەم سورەتە:

ئەم سورەتە بە هۆی كۆمەڵێك لە قورەیشییەكان هاتە خوارەوە، كە دەیانگوت: ئەی موحەمەد بكەوە شوێن ئاینەكەمانو ئێمەش شوێن ئاینەكەت دەكەوین، ساڵێك تو خوداكانی ئێمە بپەرستەو ئێمەش ساڵێك خودای تۆ دەپەرستین، ئەگەر خودای تۆ لە ئەوانەی ئێمە باشتر بوو، ئەوا هاوبەشتینو بەشی خۆمان دەبەین،وە ئەگەر ئەوەی ئێمە باشتر بوو لەوەی تۆ ئەوا هاوبەشمانیو بەشی خۆت وەردەگریت، پێغەمبەر(دخ) فەرمووی: پەنا بە خودا كە هاوبەشی بۆ پەیدا بكەم. بۆیە خودای گەورە ئەم سورەتی هەناردە خوارەوە((قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ...)) تا كۆتایی سورەتەكە.

پێغەمبەر (دخ) چووە لای كەعبە كە كۆمەڵێك لە قورەیشییەكانی لێ بوو وە ئەم سورەتەی بۆ خوێندنەوە تا كۆتاییەكەی، بەمەش لێی بێ ئومید بوون.

## گفتوگۆ :

١ – هۆی هاتنه خوارەوەی سورەتی ئەلكافرون چی بوو؟

٢ – پێغەمبەر (دخ) بۆ یەكەم جار سورەتی ئەلكافرونی لە كوێ خوێندەوە ؟

# بنچینەکانی باوەڕ

باوەڕپێ کردن و دڵنیاییە، لە زاراوەی شەرعی باوەڕکردن بەخوایە، باوەڕ بە فریشتەکانی، باوەڕ بە پەڕتووکەکـانی و باوەڕ بە پێغەمبەرەکانـی، باوەڕ بە ڕۆژی دوایی، جا ئەم پێنج شتەن کە خولگەی دەرون و بیرکردنەوەی لەسەرە، لە ئێستا و دوا کارەکەیدا، لە کاروباری ژیانی دونیا، وە ئەوانەی بارەکانی تیایا باش ئەبن، وە لە دوا ڕۆژی چاوەڕوانکراو کە ڕوبدات لەم ژیانەی دونیادا، یا ئەوەی پاش مردن ڕودەدات و لە کاتی زیندوکردنەوە و بڵاوکردنەوەیدا تا مرۆڤ پێویست بێت لە سەری کە باوەڕ بە شەش بنەماکەی بروا بکات و کە ئیسلام پێناسەی کردوون و وەك لە سورەتی (البقرة)دەبینین (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ)(البقرة ٢٨٥) کاتی پرسیار لە پێغەمبەرکرا (د.خ) دەربارەی واتای بروا فەرمووی: کە باوەڕیکەی بەخودا و فریشتە و پەڕتوك و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی. باوەڕ بە قەدەر باشی و خراپی. (مسلم والبخاری گێرایتیانەوە).

## ١- باوەڕکردن بە خودای شکۆمەند و گەورە:

باوەڕکردنی بێ سێ و دوو بە بوونی خودای گەورە وەك خوا و خودا و یەك پەرستراو کە هاوتای نیە، وە باوەڕ کردن بە وناو و خەسڵەتانەی لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەر هاتوە بەبێ گۆڕینی واتاکانی یا لێکچواندنیان بە خەسڵەتەکانی بە دیهینراوی یا گونجاندن یا لە کارکردن. دەبینین کە بڕواکردن بە خودا لە جیاتی باش زانینی بونەوەر و دەروندا دەبێت. وە ئایەتەکان ڕێگەمان نیشان دەدەن و پێویستی باوەڕکردن بەخودای پاك و بەرز دەمان ناسێنن.وە ڕێگەمان نیشان دەدەن بەڵکو دەیسەلمێنێت سەلماندنێکی پتەو و یەکلاکەرەوە لەسەر تاکی بەدیهێنەری شکۆمەند و گەورە (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (فصلت ٥٣)

## ٢- باوەڕکردن بە فریشتە:

باوەڕکردن بە فریشتە باوەڕکردنی یەکلاکەرەوەیە کە خودا فریشتەی لە روناکی بەدی هێناوە و ئەوان هەنە، ئەوان سەرپێچی ناکەن لەوەی خودا فەرمانی پێ کردون، ئەوان هەڵساون بەو فەرمانەی کە خودا فەرمانی پێ کردون کە پێی هەڵسن. خودای گەورە فەرموویەتی لە سورەتی (البقرة) : (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ) (البقرة ١٧٧)

## ٣- باوەڕکردن بە پەڕتوکە ئاسمانیەکان:

واتای ئەوەیە کە باوەڕ بەو پەڕتوکانە بکەین کەخودا لەسەر پێغەمبەر(د.خ) و نێردراوانی هێناوەتە خوارەوە. لەو پەڕتوکانە ئەوەی خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هێناون. لەوان ناوی نەهێناون. خودای گەورە لە سورەتی (الاعلى) فەرمویەتی:( إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَى (١٨) صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى (١٩))

ئەو پەڕتوکانەی کە خودای شکۆمەند و بەرز لە پەڕتوکە پیرۆزەکەیدا ناوی ناون: التوراة، ألانجيل، الزبور، صحف ابراهيم، القرأن.

جا (التوراة) بۆ گەورەمان (موسى)یە و (الانجيل) بۆ گەورەمان (عيسى)یە و (الزبور) بۆ گەورەمان (داود)ە و (الصحف)بۆ گەورەمان (ابراهيم)ە و قورئانی موعجیزەی ئەمر بۆ گەورەمان (محمد)ە.

## ٤- باوەڕکردن بە پێغەمبەر و نێردراوەکان:

باوەڕکردنە بەوانەی خودای گەورە لە پەڕتوکەکەی ناوی هێناون لە نێردراو و پێغەمبەرەکانی، وە باوەڕکردن بەوەی کە خودای شکۆمەند و گەورە جگە لە وان نێردراوانی دیکەشی ناردوە، و ئەو پێغەمبەرانەی ژمارە و ناوەکانیان نازانرێت تەنها خودای بەرز نەبێت.

خودای بەرز لە قورئانی پیرۆزدا باسی بیست و پێنج لە پێغەمبەر و نێردراوانی کردوە و ئەوانیش: (ادم، نوح، ادريس، صالح، ابراهيم، هود، لوط، يونس، اسماعيل، اسحاق، يعقوب، يوسف، ايوب، شعيب، موسى، هارون، اليسع، ذوالكفل، داوود، زكريا، سليمان، الياس، يحيى، عيسى، محمد) درود و سلاوی خوا لەسەر هەموویان بێت.جا ئەو نێردراو و پێغەمبەرانە پێویستە باوەڕ بە نامە و پێغەمبەرایەتیەکانیان بێنین. باوەڕ کردن بە نێردراوان بنەمای چوارەمە لە بنەماکانی بڕوا. جا باوەڕی بەندە دروست نابێت تەنها بە باوەڕ پێ کردنیان.

## ٥- باوەڕکردن بە ڕۆژی دوایی:

واتای باوەڕکردن بە هەموو ئەو شتانەی کە خودای شکۆمەند و گەورە و پێغەمبەری خودا (د.خ) پێیان ڕاگەیاندوین لەوەی پاش مردن دەبێت لە فیتنەی گۆڕ و ئازار و خۆشیەکەی، زیندوکردنەوە و حەشر کردن و پەڕتوکەکان و لێ پرسینەوە و تەرازوو حەوز و پردی سیرات و تکاکردن و بەهەشت و ئاگر، ئەوەی خودا ئامادەی کردوە بۆ هەموو خەڵکەکانیان.

گفتوگۆ :

**بنەماکانی باوەڕ بژمێرە. وە باسیان بکە.**



# کاری بەسود



ڕۆژێکیان مامۆستای پەروەردەی ئیسلامی هەستا بە دابەشکردنی قوتابیانی پۆلی شەش بەسەر چوار دەستەدا و داوای کرد هەر دەستەیەك نموونەیەك دەربارەی کاری بەسود لە کۆمەڵدا بنووسن، دوای ئەوەی بیرۆکەکەی بۆیان شیکردەوەو گفتوگۆیان لەسەری کرد لە سۆنگەی فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەر (خير الناس انفعهم للناس) ئەم پرسیارانەی خوارەوەشی کردە بناغەیەك بۆ نووسینی بابەتەکە:

کاری بەسودو چاك چییە؟ چۆن مرۆڤ دەتوانێت کارێکی بەسود ئەنجام بدات؟ ئایا سود بۆ کۆمەڵگە باشترە یان تەنها بۆ خود؟ نموونەیەك دەربارەی کاری بەسود باس بکە. کەی کاری بەسودو چاك سودی بۆ خاوەنەکەی دەبێت؟ ...هتد هەروەها مامۆستا پێی ڕاگەیاندن کە لە وانەی داهاتوودا لە هەر دەستەیەك یەکێکیان هەڵدەستێت بە خوێندنەوەی بابەتەکەیان کە ئامادەیان کردووە.

خوێندکارەکان ئەم شێوازی فێرکردنەیان زۆر پێ خۆشبوو هەموو دەستەکانیش داواکاری مامۆستایان ئامادە کردبوو چاوەڕوانی وانەی داهاتووی پەروەردەی ئیسلامیان دەکرد، لەپاش

هەندێك گفتوگۆ وە لەسەر داواكاری مامۆستا، كاوە لەجیاتی دەستەی (سێو) كە پێشتر دەستەكە وەك نوێنەری خۆیان هەڵیانبژاردبوو، ئەو باسەی ئامادەیان كردبوو بۆ ئامادەبووانی خوێندەوە كە باسی پیاوێكی دەوڵەمەندی نیشتمانپەروەری ئایینپەروەر بوو كە پردێكی دروستكردبوو، و سودی ئەم كارەو پاداشتی خاوەنەكەی لەلای خودای گەورەیە، مامۆستا سوپاسیكردن دواتر شاناز لەجیاتی دەستەكەی خۆی هەستا كە دەستەی بلبلەكان بوو باسی سودی دارچەقاندنی كرد لەبەر بەرو سێبەرو جوانیەكەی و كاریگەری لەسەر خاوێنی ژینگە، هەموو قوتابییان بۆ ئەم بابەتە هەستیان بزواو هەندێكیان بڕیاریاندا لەپێش ماڵەكانیان دار بچەقێنن لە وەرزی گونجاو بۆ دار چەقاندن.

مامۆستا زۆر دڵخۆشبوو بەم كارە دووبارە فەرمودەی پێغەمبەری خودا كەدەربارەی كاری بەسودە لەوانەی پێشووتر باسی كردبوو بە فەرموودەیەكی دیكەی پێغەمبەر موحەمەد (د.خ) دەربارەی دار چەقاندن و روەك چاندن بۆ قوتابییان خوێندەوە كە دەفەرموویت:(( ما مِنْ مُسلِمٍ يغرسُ غرساً أو يَزرَعُ زَرعاً، فَيَأكُلُ منهُ طَيْرٌ أو انسانٌ أو بَهيْمَةٌ، الاّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)).

دەستەی (هەتاو) بابەتەكەیان دەربارەی ڕێزگرتنی میوان و چاكەكردن لەگەڵ هاوسێدا ئامادەكردبوو یەكێكیانیش بە نوێنەرایەتیان خوێندییەوە بەمەش هەموویان بەشدارییان كرد لە تەواوكردنی وانەكەدا.

مامۆستاش گوتی: ئەی ڕۆڵەكانم هەموو ئەوانەی باستان كرد كاری بەسودن و هەندێك كاری دیكەش هەن سودی خودی مرۆڤ و كۆمەڵگەیان هەیە وەك:

ئامۆژگاری و بڵاوكردنەوەی ئیسلام و ئاشتیو زانستو خۆشەویستیو هاوكاری بۆ كاری چاكەو بەخشین بە هەژارانو سەردانی كەسو كارو ئاشتكردنەوەی خەڵكو سەردانی نەخۆش ...هتد. قسەكانی بەوە كۆتایی پێ هێنا: دەبێت هەر یەك لە ئێمە كارێكی بەسود لە بەرنامەی كاری ڕۆژانەی دابنێت بەمەش خوداو خەڵكی خۆشیان دەوێتو لێی ڕازی دەبن.

**گفتوگۆ:**

١ – کاری چاکو بەسود چییە؟

٢ – کەی کاری چاک سودی بۆ خاوەنەکەی دەبێت؟

٣ – ئایا سود گەیاندن بە کۆمەڵگە باشترە یان تەنها بە خودی خۆت؟

**چالاکی:**

ئەم فەرمودە پیرۆزە لەبەر بکە:

((خیر الناس انفعهم للناس)).

وانەی شازدەم

# بەسەرکردنەوەی نەخۆش



قوتابییەکان لە پۆلدا دانیشتبوون چاوەڕوانی مامۆستایان دەکرد، بۆ خوێندنی وانەی پەروەردەی ئیسلامی، پاش چەند چرکەیەك مامۆستا (دیمەن) هاتە پۆلەوەو دیتی قوتابییەکان بە هێمنییەکی نا ئاسایی دانیشتوون، لە پاش ئەوەی تەماشایکردن سوپاسیانی کرد لە سەر بایەخدانیان بە پاکو خاوێنی پۆلەکەیانو ڕێکخستنیو هێمنیان، کاتێك ڕووی لە لای چەپی کرد بینی شوێنی قوتابی (بەهزاد) چۆڵە، بۆیە لە (جوان)ی هاوڕێی پرسی:

- بەهزاد لە کوێیە، ئایا چی بە سەر هاتووە؟

جوان وەڵامی دایەوە: پێش دوو ڕۆژ بە هۆی ڕووداوی ئۆتۆمبیلەوە بریندار بووەو باسکی چەپی شکاوەو ئێستا لە نەخۆشخانەیە.

مامۆستا گوتی: ئایە کەستان سەردانتان کردووە؟

دووان لە برادەرەکانی وەڵامیان دایەوە: بەڵێ، دوای نیوەڕۆی دوێنێ بە ناوی گشت قوتابییەکانەوە چووینە سەردانیو سڵاوو داخوازی هەمووانمان بۆ چاکبوونەوەیمان پێگەیاند، ئەویش بەوە زۆر دڵ خۆش بوو.

- ئایە دیاریتان پێ بوو؟

- بەڵێ دەسکێك گوڵمان بۆی کڕیبوو و بەناوی هەمووانەوە پێشکەشمان کرد.

- چەند لە لای مانەوە؟

- کەمتر لە پازدە خولەك ؟

- مامۆستا دیمەن گوتی: چاکتان کرد رۆڵەکانم، چونکە بەسەرکردنەوەی نەخۆش ئەرکێکی ئاینیو رەوشتییە، و مافی موسوڵمانە بە سەر موسوڵمانەوە، چونکە هۆی زیاد بوونی ئاشنایی‌و خۆشەویستییە لە نێوانماندا، لە بەر ئەوەی ئێمە وەك ئەندامەکان یەك جەستەین دەبێت یەکگرو هاوکاری یەکدی بین.

خودای گەورەو پێغەمبەرەکەشی فەرمانیان بە گشت موسوڵمانان کردووە ئەم کارە بکەن، بۆ ئەوەی برایەتیمان بە هێزتر بێتو رەزامەندی خوداو پاداشتی بە دەست بێنین و چیرۆکێکی بۆ گێرانەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەر (دخ) پیرێژنێك هەبوو ئاوی بە پێغەمبەردا دەکردو خاشاکی تێدەگرت کاتێك بە لای ماڵەکەی تێدەپەری، دوای ئەوەی ئەو پیرێژنە دیار نەما بۆ ماوەیەك، پێغەمبەر (دخ) پرسیاری لە حاڵی کرد، پێیان گوت کە نەخۆشە، پێغەمبەری میهرەبان (دخ) چووە سەردانی لە بەر ئەوەی ماڵی لە ماڵیەوە نزیك بوو و دوعای خێری بۆ کرد.

پیرێژنەکە زۆر پەشیمان بۆوە لەو کارەی دەیکرد، لە دوایی ئەو کردارە میهرەبانە، و زانیشی کە ئیسلام ئاینی بەزەییو میهرەبانیو لێ خۆشبوونو لێبووردنە، بۆیە باوەری هێناو گەواهی دا کە: تەنها خودا خودایەو موحەممەد پێغەمبەری خودایە.



**سوود:**

هەموو شتێك داب و نەریتی خۆی هەیە، ئادابی سەردانی نەخۆشیش ئەمانەن:

١- هەڵبژاردنی کاتی گونجاو بۆ سەردانەکە.

٢- زۆر لەلای نەخۆشەکە دانەنیشیت.

٣- بە هێمنی قسە بکەین.

٤- ئەوانەی سەردانی نەخۆش دەکەن ژمارەیان زۆر نەبێت.

٥- لە دڵەوە نزای چاکبوونەوەی بۆ بکەین.

## راهێنان

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە ووشەی گونجاو پڕ بکەرەوە کە لەبەرامبەردا نووسراوە:

ئ- موسڵمان چەند مافێکی لەسەر برای موسڵمانی هەیە کە ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| ١- ................. لەکاتێك دا کە دەیبینێت. | داوەتکردنی |
| ٢- ................. ئەگەر نەخۆش بوو. | سەردانکردنی |
| ٣- ................. کە دەپژمێت. | سڵاولێکردنی |
| ٤- وەڵامدانەوەی ..................... | نزاکردن بۆی |

ب- چوار نەریت لە نەریتەکانی سەردان بژمێرە.

١-

٢-

٣-

٤-

# ناوەڕۆك